الأهَدُّ: ترسنۆك.

التَّهْدادُ: ترساندنو هەڕەشە لێکردن بەسزا.

الهَادُّ: دەنگی گڕو ناخۆش ٥ دەنگی دەریاو هاژەی شەپۆلی.

الهادة: هەور (دەنگی هەورە تریشقە).

الهَدَاءُ: لەسەرە خۆییو هێدیەتی ٥ دەگوترێ: (هَدَاذيكَ): لەسەر خۆبە ٥ دەشگوترێ: (قوم هداد): قەومێکی ترسنۆکن.

الهُدَادَةُ: ترسنۆك.

الهَدُّ: دەنگی گڕو ناخۆش ٥ پیاوی ترسنۆكو لاواز ٥ پیاوی سەخی.

الهِدُّ: ترسێنراو ٥ ترسنۆكو لاواز ٥ دەگوترێ: (إني لغير هِدٍّ).

الهِدَّانُ: پیاوی گێلو تەبیاتو وشك.

الهَدَّةُ: دەنگی کەوتنە خوارەوەی شتی قورس ٥ رمبە، تمبە ٥ زرمبە.

الهَدُودُ: زەوی دەشتاییو نەرمەلان ٥ کۆسپو تەگەرەی گەورە ٥ دەشگوترێ: (أكمة هَدُودٌ): گردێکی تەلانو ناخۆشە ناتوانی پێیدا برۆی ٥ گردێکی سەر بەرەو ژێرە.

الهَدِيُّ: گێزەو وێژەی دەنگ ٥ پیاوی درێژ.

هَدَرَ هَدْراً: پوچ بوو، بەفیڕۆ ڕۆیی ٥ دەگوترێ: (هَدَرَ الشَيْءَ): شتەکەی پوچ کردەوە ٥ (هَدَرَ البعيرُ): حوشترەکە دەنگی خۆی خواردەوە ٥ (هَدَرَ الحمامُ): کۆترەکە دەنگی خۆی لەقورگیا لەراندەوە ٥ (هَدَرَ الغلامُ): منداڵەکە قسەی کرد فێری قسە بوو.

هَدَرَ الشرابُ: شەرابەکە کوڵی ٥ (هَدَرَ اللبنُ): شیرەکە توێی گرت ٥ لای سەرەوەی رەق بوو ٥ (هَدَرَ الجوفُ): سکی بای کرد، هاوسا.

هَدَرَ الشَيْءُ هدوراً: شتەکە بەر بۆوە.

هَدَرَ العُشْبُ: روەکەکە درێژ بوو، پێگەیی، زۆر بوو.

أهْدَرَ الشَيْءَ: شتەکەی پوچ کردەوە، دەگوترێ: (أهْدَرَ دَمَه): خوێنەکەی بەفیڕۆ دا، سزای تۆڵەسەندنەوەی لەسەر بکوژ لابرد.

هَدَّرَ: زێدەڕەوی کرد لەلەرینەوەی دەنگو هێنانو بردنی لەقورگ دا.

تهادَرَ القومُ: خەڵکەکە خوێنی کوژراوەکانیان بەفیڕۆ داو پوچیان کردەوە.

إهدَوْدَرَ المطرُ: باران بەرێژنەو لێزمە باری.

المَهْدَرَةُ: ددانی بچوکی پێشەوە.

الهادِرُ: شیری توێ گرتوو کەلای سەروی رەق بووبێو ژێرەوەی شل بێ.

**الهادِرَة:** (أرض هادرة): زەوییەکە گیاو گژی زۆرە ٥ (ك: هوادر).

**الهَـدْرُ:** بەفیرۆچـون ٥ بـەتاڵو پـوچ ٥ دەگـوترێ: (ذهــب دمُــهُ هَــدْراً): خــوێنی بــەفیرۆ چــوو ٥ نەتوڵـە لەبکوژ ستێندرا نـەخوێنی ومرگـیرا ٥ (ذَهَبَ سـعیه هَـدْراً): کۆششەکەی بەهیچ چوو بێ سود بوو.

**الهَـدَرُ:** بـەمانا (الهَـدْرُ) دێ ٥ خـوێریو هەتیومچەی بێ خێرو بێر.

**الهِدْرُ:** تەمبەڵی بێ خێر.

**هَدَغَهُ هَدْغاً:** شکاندی، برینداری کرد.

**انْهَدَغَ الشَیْئُ:** شتەکە شکا ٥ دەگـوترێ: (إنهدغت الرطبة).

**المُنْهَدِغُ:** حەڵوای نەرم، هەر خواردنێـك نەرم بێ.

**هَدَفَ الیه هَدْفاً:** چووە ژوور.

**هَدَفَ فلانٌ للخمـسین:** فلاَنکەس تەمـەنی لەپەنجا نزیك بۆوە.

**هَدَفَ الرجلُ هَدْفاً:** تەمبەڵو لاواز بوو.

**هَدَفَ الی الشَیْئ:** چو بۆ شتـەکەو پەلـەی کرد بۆلای.

**اهْدَفَ:** نزیك بۆوە.

**أهْـدَفَ فـلان علـی التـلِّ:** فلاَنکـەس بەسەر تەپۆلکەکەی دا ڕوانی.

**أهْدَفَ الیه:** پەنای بۆبرد.

**أهْدَفَ له:** هەستـو پێشوازیی لـێکرد.

**أهْـدَفَ فـلان للخمـسین:** فلاَنکـەس لەپەنجا نزیك بۆوە.

**استَهْدَفَ الشَیْئُ:** شتەکە بەرز بۆوە.

**استَهْدَفَ الرجلُ:** پیاوەکە قیت هەڵسایە سەرپێ خۆی خوار نەکردەوە.

**اسْـتَهْدَفَ فـلان للخمـسین:** فلاَنکـەس تەمەنی لەپەنجا نزیك بۆوە.

**المُهْدِفَةُ:** ئافرەتی گۆشتن.

**الهادِفُ:** بێگانەو غـەریب ٥ دەگـوترێ: (هـل هـدف إلیکم هـادف): ئـەرێ کەسێـکی غـەریب هاتـە لاتـان؟ ٥ هـەروا نـاوە بـۆ شتێـك مەبەسـت بپێـکێ ٥ دەگـوترێ: (أدب هـادف، وفن هادف).

**الهَادِفَـةُ:** کـۆڕو کۆمـەڵ ٥ دەگـوترێ: (جاءت هادفة من الناس).

**الهَدَافُ:** ئەوکەسەی بـەلێزانی تۆپەکـە ئاڕاستەی هەدەف دەکا.

**الهَدَفُ:** هەرشتێـك بـەرز بـێ ٥ نیشانە کە تیرو تفـەنگی ئاڕاسـتە دەکـرێ ٥ (مـــەرمای کـــورەی قـــەدەم) ٥ هـەنگاوتنی نیـشانە ٥ قـونگرانو خەواڵوو قەڵەوو بێ خێر.

**الهِدْفُ:** جەستەی مل درێژ.

**هَدَكَ البِنَاءَ:** بیناکەی ڕوخاند.

**هَدَكَ فلان:** فلاَنکەس خۆی گێل کرد.

**تَهَـدَّكَ علـی فـلان بـالکلام:** بەقسە

هێرشی کرده سەر فلانو جوێنی پێدا.

**هَدَلَ الحمامُ او الغلامُ هديلاً:** کۆترەکە یان منداڵەکە گمە گمی کرد.

**هَدَلَ الشيْئَ هَدْلاً:** شتەکەی بەرەو خوار شۆڕکردەوە.

**هَدِلَ البعيرُ هَدَلاً:** حوشترەکە لیچی شۆڕ کردەوە.

**هَـدِلَ الرجـلُ:** پیاوەکە لیچی خوارەوەی شۆڕبۆوە.

**هَدِلَ السحابُ:** هەورەکە داکەوتە سەر زەوی، شۆڕبۆوە ٥ (وهـو أهْـدَلُ وهـي هدلاء).

**تَهَدَّلَ الشيْئُ:** شتەکە شۆڕ بۆوە، شل بوو داهاتو چەمایەوە ٥ سیس بۆوە ٥ دەگوترێ: (تهدلت الشفة وتهدلت الخصيةُ وتَهَدَّلَ التمر وتَهَدَّلَ الثوبُ): قوماش یان پۆشاکەکە پان بۆوە.

**الهَـدَالُ:** گیایەکی هەڵتۆقیوە بەسەر لقو پۆپی درەختەوە دەژیو تەرایی خوێنی درەختەکە هەڵدەمژێ بەکوردی پێی دەگوترێ تڕ تڕە ٥ هەروا ناوە بۆ لقو پۆپی شۆڕبۆوەی درەخت.

**الهَدَالَةُ:** تاقمو کۆمەڵ.

**الهِدْلُ:** تۆراغ، ماستی خەستەوە بووی ترش.

**الهَدِيلُ:** دەنگی کوتر گمە گمی کۆتر ٥ کۆترە نێرەی کێوی ٥ پیاوی توکن ٥ پیاوی تەمبەڵی قونگران.

**الهَيْدَلَـةُ:** (الحـداءُ): گۆرانی حوشتر لێخوڕ.

**هَـدَمَ البنـاءَ هَـدْماً:** بیناکەی روخاند هەڵیوەشاند.

**هَدَمَ القتيل:** خوێنی کوژراوەکەی بەفیڕۆ دا.

**هَدَمَ الثوبَ:** کراسەکەی پینەکرد.

**هَدَمَ فلاناً:** لەفلانکەسی دا پشتی شکاند ٥ دەگوترێ: (هَدَمَ فلان ما أبرمه من الأمر): فلانکەس ئەوکارەی بڕیاری لەسەر دابوو بیکا هەڵیوەشاندەوە.

**هَدِمت البئرُ:** بیرەکە ئەملاو ئەولای روخا ناویو پڕبۆوە.

**هُدِمَ فلان:** فلانکەس توشی سەرە گێژی بوو ئاوی لێ سورا.

**أهـدَمَ اللبنَ:** شیرەکەی بەسەر شیری ترشاودا دۆشیو بزرکا.

**هَدَّمَ:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (هَدَمَ)دێ.

**تَهَـدَّمَ البنـاءُ:** باڵەخانەکە وردە وردە تێك روخاو هاتەخوار.

**تَهَدَّمَ فلان على فلان غضباً:** فلانکەس بەسەر فلان دا روخاو هەڕەشەی لێکرد.

تَهَدَّمَ العجوز أو النابُ: پیرەژنەکە یان ددانەکە پۆلکاو فەوتا.

المهدومُ: شیری ترشاو ماستی ترش.

المهدومـةُ: دەگـوترێ: (أرض مهدومـة): زەوییەکە بارانێکی کەمی لێباری.

الهُدامُ: ئاو لـێ سوڕانو سـەر گێـژبونو حاڵەتێـکە لـەناو دەریـا دا توشـی مرۆڤ دەبێ.

الهَـدْمُ: بـەفیرۆ چـون ٥ دەگـوترێ: (دم هَدْمٌ): خوێنەکەی بە فیرۆ چوو.

الهِدْمُ: پیرەمێردی کەنەفت ٥ گۆرەوی‌و خـوففی کـۆن ٥ کراسـی کـۆن‌و پینـەکراو ٥ پۆشـاکی خـوری پینەکراو (ك: أهدام وهدام).

الهَدْمَةُ: وەجبە پارە ٥ مەبلەغێك پارە ٥ بارانی کەم ٥ وردە باران.

الهِدْمَةُ: پۆشاکی رزیو ٥ (ك: هدوم).

الهَـدَمُ: خـوێنی بـەفیرۆ چـوو ٥ هەرشتێك بروخێ‌و بکەوێتە خوار ٥ دەگـوترێ: (فـلان شـهید الهَـدَم): پـۆش‌و لـەوەڕی سـاڵی پێـشوو کەلەپەناو پاساردا مابێتەوە.

الهَـدِمُ: گێـل‌و ئەحمـەق ٥ سـەر ڕەق‌و خراپەکار.

الهَـدِیمُ مـن النبـات: پـڵ‌و پوشـی سـاڵی رابردو.

هَـدْمَلَ الرَّجُـلُ: پیاوەکـە پۆشـاکەکانی خۆی دڕی.

الهِـدْمِلُ: کـۆن‌و شـلەپەتە ٥ کراسـی رزیوو کـۆن ٥ کەسێـك تـوك‌و مـوی زۆر بێ‌و قژژاکاو بێ.

الهِدَمِلُ: قورس‌و گران ٥ گردی پتەو.

الهِدَمْلَـةُ: کۆمەڵـە ئادەمیزادێـك ٥ گردێـکی پـڕ دراو درەخـت ٥ رۆژگاری دێرین.

هَـدَنَ فـلان هُـدوناً: فلانکـەس دامرکـا، راوەستا، کوژایەوە ٥ گێل‌و نەفام بوو.

هَدَنَ فلاناً: فلانکەسی کوشت ٥ فێڵی لـێ کردو پەیمانی پێی دابوو نەیبردە سەر ٥ لەنیازی دانیە ئەو بەڵێنەی بەفلانی داوە جێ بەجێی بکا.

هَدَنَ الصَبِيُّ: منداڵەکەی ژێـر کـردەوە ٥ ئاشتی کردەوە.

هَدَنَ العَـدُوَّ: شەڕی دژی دوژمـن راگـرت، وازی لەدژایـەتیکردنی هێنـا ٥ بۆماوەیەك ئاگربەستی لەگەڵ دا کـرد ٥ دەشـگوترێ: (هَـدَنَ الخَـبرُ فلانـاً): هەواڵەکە فلانکەسی لەمەبەستی خۆی لادا.

هُدِنَ فـلان عنـك: شتێـکی بچوك‌و کەم بایەخ فلانکەسی لەتۆ رازی کرد.

أهْـدَنَ الفـرسُ: ئەسپەکە مـانی گـرت‌و غاری نەدا.

أهْدَنَ الخَيلَ: ئەسپەکەی قەدباریك کرد

٥ وای لەنەسپەکە کرد قەد باریك بێ.
هَدَّنَ فلاناً: فلانکەسی ئارام کردەوە ٥ تەمبەڵو قونگرانی کرد.
هَدَّنَ الصَّبِيَّ: منداڵەکەی ژیرکردەوە ٥ دەگوترێ: (هَدَّنت المرأةُ طفلها): ئافرەتەکە منداڵەکەی ژیرکردەوە.
هادَنَ فلاناً: ئاگر بەستی لەگەڵ فلان کرد، شەڕی دژ ڕاگرت بۆ ماوەیەك.
إنهَدَنَ فلان عن عزمه: فلانکەس ورەی دابەزی، خۆی ڕانەگرت.
تَهَادَنَ القومُ: خەڵکەکە ئاشتەواییان بڕیار دا ٥ یان وازیان لەشەڕو ئاژاوە هێنا بۆ ماوەیەك.
تَهَادَنَ الأمورُ: کارەکان جێگیر بوون.
تَهَدَّنَ الرجلُ: پیاوەکە گێلو نەحمەق بوو.
المَهْدُونُ: گێلو نەفام.
الهِدانُ: گێلو نەفامو تەمبیات وشك ٥ قونگرانو خۆدزەوە لەشەڕو نەبەردا ٥ خەو خۆشو تەمبەڵ، حەزی لەخەوی بەیانیانەو زوو ناچێ بۆ سەرنیشو کاری خۆی.
الهَدِنُ: شلو شێواو ٥ شۆڕەوە بوو.
الهُدْنَة: ئاشتی دوای شەڕ ٥ یان ماوەی دوا شەڕ کەشەڕ ڕابگیرێو دوژمنەکان خۆ ئامادە بکەن بۆ ئاشتەواییو مەرج دانان بۆیەکتری ٥ تەمبەڵیو خۆپارێزی ٥ ساردبونەوەی گورو تینی پیاو لەکارێکو هیوەر بوونەوەی عەزمو جەزمی بەهۆی بیستنی هەواڵێك.
الهیدان: گێلو نەحمەق ٥ ترسنۆك.
هَدْهَدَ الطائرُ: باڵندەکە قرە قرو قاژە قاژی کرد.
هَدْهَدَ الشَّيْءَ: شتەکەی جولاند، وەحەرەکەی خست ٥ جمو جوڵی پێ کرد، هەڵی پەڕاند ٥ دەگوترێ: (هَدْهَدَتْ الأُم صَبِيَّها): دایکەکە منداڵەکەی هەڵپەڕاند ٥ یان ڕایژاند بۆئەوەی خەوی لێ بخا.
هَدْهَدَ فلان الشَّيْءَ: فلانکەس شتەکەی لەبەرزییەوە هاویشتە خوار ٥ دەشگوترێ: (يُهَدْهَدُ اليَّ كذا): وادێتە خەیاڵم، دڵم بۆ ئەوە دەچێ ئەو شتە وابێ.
الهُدْهُدُ: پەپوسلێمانکە ٥ گمە گمی کۆتر ٥ (ك: هَداهِد).
هَدَى فلان هُدىً وهدياً وهدايةً: فلانکەس ڕێگای ڕاستی گرتەبەر ٥ دەگوترێ: (هَدَى فلان هدي فلان): فلانکەس ڕێبازی فلانکەسی گرتە بەر، پەیڕەوی ئەوی کرد.
هَدَى فلاناً: هیدایەتی فلانکەسی دا خستیە سەرڕێگای ڕاست.

**هَدَى فلاناً الطريقَ:** ڕێگای نیشانی فلان داو شارەزای کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: (وأهدنا الى سواء السراط).

**أهْدَى الهَدْيَ أو الهَدِيَّ الى الحرم:** ئاژەڵی قوربانی برد بۆ مەککە بۆئەوەی بیکاتە قوربانی.

**أهـدى الهديـةَ الى فـلان:** دیاری بۆ فلانکەس نارد بەمەبەستی ڕێز لێگرتن و دۆستایەتی.

**هـادى فـلان فلانـاً:** هەریەك لەودوانە دیارییان بۆ یەکتر نارد.

**هادت فلانـةُ فلانـةَ:** هەریەك لەو دوو ئافرەتـە خواردنیـان هێنـا بـۆ شوێنێك و لەوێ خواردیان.

**هـادى فـلان فلانـاً:** فلانکەس بڕیاری شەڕو مستانی دژی فلان دا ٥ وای لێ کرد لەڕۆیشتن دا لارە لار بکا.

**هـادن فـلان فلانـاً الـشِّعْرَ:** فلانکەس بەشیعر هەجوی فلانی کرد.

**هَدّى العروسَ الى بعلها:** بوکەکەی نارد بۆ زاوا.

**هَدّى الهدية الى فلان وله:** دیاری بۆفلان نـارد ٥ دەشـگوترێ: (فـلان یهـدّی للنـاس): فلانکـەس زۆر دیـاریی دەنێرێ بۆ خەڵك.

**اهتَـدى:** ڕێبـازی راسـتی دۆزیـەوە ٥ شارەزابوو.

**یَهْدّي ویَهِدّي:** شارەزای دەکا ڕێی ڕاستی نیـشان دەدا ٥ قورئـان دەفـەرموێ: {أَفَمَن يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لاَّ يَهِدِّيَ} ٥ هـەروا بـەمانا هەوڵدان و شارەزایی کردنـی خـەڵك بۆ ڕێبازی ڕاست دێ ٥ یان لەسەر ڕێبازی ڕاست بەردەوام بوو مایەوە.

**اهتدى فلان إمرأته:** فلانکەس ژنەکەی وەگری خۆی کرد.

**اهتدى الفرسُ الخَیلَ:** ئەسپەکە بـوو بـە پێشەنگی ڕەوە ئەسپەکان.

**تهادي فلان بين رجلين:** پیاوەکە چووە نـاو شـانی دوکەسـەوە خـۆی خستە سەرشانی دوکەس لەبەر بێ هێـزی ٥ دەگوترێ: (جاء فلان یتهـادی بـین اثنين).

**تهادى القوم:** خەڵکەکە لەناو خۆیان دا دیارییان بۆیەکتر نارد.

**تهادت المـرأةُ:** ئافرەتەکە لەڕۆیشتن دا لارو لەنجـەی کـردو کەسـی لەگـەڵ نەبوو.

**تهـدّی فـلان:** فلانکـەس هـەوڵی شـارەزابوونی دا ٥ خـەریکی شارەزایی کردنی خەڵك بوو.

**اسـتهدى فـلانٌ:** فلانکـەس هـەوڵی دۆزینەوەی ڕێگای راستی دا.

**اسـتهدى فلانـاً:** داوای لـەفلان کـرد

ڕێگای ڕاستی نیشان بدا.

**المِهْداءُ:** کەسێك زۆر دیاریی بنێرێ بۆ خەڵك.

**المِهْدی:** ئەو تورەکەو زەرفەی دیارییەکەی تێدا دەنێردرێ.

**المُهَیدِیَةُ:** دەگوترێ: (فلان علی مُهَیْدیته): فلانکەس لەسەر حاڵو وەزعی پێشووی خۆیەتی.

**الهادی:** ناوێکە لەناوە جوانەکانی پەروەردگار ٥ چاوساغو ڕێ نیشاندەر ٥ (ك: هداةٌ) ٥ هەروا ناوە بۆ ئەستۆ ٥ شێر ٥ سەرەتیر ٥ (ك: هواد).

**الهادیة:** پێشەتای هەموو شتێك ٥ عەصاو گۆچان ٥ بەردێك لەناو ئاودا بێو هەندێکی دەرکەوتبێ ٥ (ك: هوادٍ).

**هادیات الخیل:** پێشەتای ڕەوە ئەسپ.

**هوادی الخیل:** پێشەتای ڕەوەئەسپ.

**هوادي اللیل:** سەرەتای شەو.

**هوادي الإبل:** یەکەم وەجبەی حوشتر کە دەردەکەون.

**الهداء من الرجال:** پیاوی زەبوونی کەم عەقڵو کاڵفام ٥ وەرگنو زۆرخۆرو تەمبەڵ.

**الهَدَاةُ:** لۆغەتێکە لە (الأَدَاة).

**الهُدی:** ڕۆژی ڕوناك ٥ ڕێباز ٥ ڕێگای ئاشکراو شارەزایی کەر ٥ قورئان دەفەرموێ: {هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ} ٥ هەروا ناوە بۆ پەروەردەکردنو شارەزایی کردنو گەیاندنی ئادەمیزاد بەمەبەست بەشێوەی هێدیو هێمن ٥ قورئان دەفەرموێ: {إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَى}.

**الهَدْيُ:** ئەو ئاژەڵەیە بەدیاریی دەبردرێ بۆ حەرەم بۆ قوربانی ٥ پیاو ماقوڵو ڕێزداری وڵات و بنەماڵە ٥ دەگوترێ: (فلان هدی بني فلان) ٥ ڕێو شوێنو ڕەوشت ٥ دەگوترێ: (فلان حسن الهدی): فلانکەس هەڵسو کەوتی جوانە.

**الهَدْیَةُ:** ڕێبازو دابو نەریت ٥ حوشتری گەورەی تەمەن پێنج ساڵ.

**هدیة الأمر:** لایەنی شت.

**الهِدْیَةُ:** بەمانا (الهَدْیَة) دێ ٥ لایەنو جیهەتو شوێن ٥ ڕێبازی ڕاست ٥ دەگوترێ: (ضلَّ فلان هدیته): فلانکەس لەڕێبازی ڕاستی خۆی لای دا.

**الهُدَیَّةُ:** نیازو مەبەست ٥ ئەوشوێنەی دەتەوێ بۆی بچی ٥ دەگوترێ: (ضلَّ فلان هُدَیَّتَهُ): فلانکەس ڕێبازی ڕاستی خۆی لێ گوم بوو ٥ دارێکە وەکوو نیر وایە بۆ ئاشو ئاعور بەکاردێ.

**الهَدِيُّ:** پیاو ماقوڵو ڕیش سپی

بنەماڵـە ٥ بـوك ٥ ئـەو ئاژەڵـەی بەدیاریی دەبرێ بۆ حەرەم ٥ دیل.

**الهُدَيَّا:** هاوشێوەو هاوشان ٥ دەگوترێ: (عندي هُدَيَّاهُ).

**الهَدِيَّةُ:** بوك ٥ دیاریی کەدۆستو خـزم دەیـدەن بەیـەکتری ٥ لەڕوانگـەی خۆشەویـستیو ڕێزگرتنـەوە ٥ (ك: هدايا).

**هَذَأَت الخيـلُ ونحوها هَـذْءاً:** ئەسپەکان لەبەر ماندویی کەوتن.

**هَذَأَ الشَيْئَ:** شتەکەی بڕیەوە بەخێرایی.

**هَـذَأَ الكـلامَ:** قـسەی زۆرو پـڕو پوچـی کردن.

**هَـذَأَ فلانـاً بلـسانه:** قـسەی ناشـیرینی بەفلانکەس گوت ٥ هەواڵێکی ناخۆشی پێ ڕاگەیاند.

**هَذِيَ من البرد:** لەسەرما مرد.

**تَهَذَّأَت القَرحَةُ:** برینەکە داوەشا.

**الهَـذّاءُ:** دەگـوترێ: (سـیف هَـذّاءٌ): شمشێری خێرا بڕو تیژ.

**الهَذّأةُ:** خاکەناز، بێڵ.

**هَذَبَ القومُ هَذباً:** خەڵکەکە گاڵو بـوغڵو چەقە چەقیان زۆر بوو.

**هَذَبَ الماءُ:** ئاوەکە جاری بوو، ڕەوان بوو.

**هَـذَبَ الـشَيْئَ:** شـتەکەی بڕیـەوە، دووڵـەتی کـرد ٥ پـاکی کـرد لەشتـی لاوەکیو پوختەکەی هێشتەوە.

**هَذَبَ النخلةَ:** درەختە خورماکەی لەپڕژو پاڵ پاك کردەوە.

**أَهذَبَ:** پەلەی کرد ٥ دەگوترێ: (أَهْذَبَ الإنـسانُ في مـشيه): ئادەمیزادەکـە لەڕۆیشتن دا پەلەی کرد.

**أَهـذَبَت الـسحابَةُ ماءَهـا:** هەورەکـە بەخێرایی بارانی باراند.

**هَـذَّبَ النخلـةَ:** دارخورماکـەی لـەپڕژو پاڵ پاك کردەوە.

**هَـذَّبَ الكـلامَ:** قـسەکەی پوختـەکرد لەوشـــــتانەی لای ڕەوانبێـــــژان بەناشیرین دادەنرێ.

**هَذَّبَ الكتـابَ:** کتێبەکـەی پوختـەکرد لەو شتانەی زێدەن‌و پێویست نین.

**الهَـذَبُ:** صـافو پوختـە، پاڵفتـە ٥ دەگوترێ: (مالي مودته هَذَبٌ).

**الهَـذِبُ:** دەگـوترێ: (فـرس هَـذِبٌ): ئەسپێکی گورج‌و گۆڵو تیژڕۆیە.

**هَذَّ الـشَيْئَ هَـذّاً وهَذاذاً:** خێـرا شتەکەی بڕی.

**هَـذَّ القـرآنَ:** خێـرا خێـرا قورئانەکـەی خوێندەوە.

**هَذَّ الحديثَ:** فەرمودەی گێڕایەوە.

**اِهْتَذَّ الشَيْئَ:** شتەکەی گورج بڕیەوە.

**هَذاذَيْكَ:** بڕایەوە، کۆتـایی هـات، تـەواو بوو.

**الهُذُّ:** تیژو بڕندە.

الهِذُّ: بەمانا (الهَذُّ)دێ.

الهُذاذُ: دەگوترێ: (ناب هُذاذٌ): کەڵبی برندە، ددانی تیژ.

الهَذّاذُ: برندە ٥ ڕێگابڕ، ئازا بۆ ڕۆیشتن ٥ دەگوترێ: (جَمَلٌ هَذّاذٌ): حوشترێکی ئازایە بۆ ڕێگا برین.

الهَذُوذُ: تیژو برندە ٥ دەگوترێ: (سِكين هذوذٌ).

هَذَرَ الرجل في منطقه هَذْراً وهَذَراً: پیاوەکە قسەی نابەجێ گوتن.

هَذَرَ اليومَ هَذْراً: ئەمرۆ گەرم بوو ٥ دەگوترێ: (يومٌ هاذِر).

هَذِرَ كلامُهُ: قسەکانی زوربەی هەڵەو پڕو پوچ بوون ٥ (فهو هَذِرٌ).

أهْذَرَ في كلامه: لە وتارەکەی دا، لەقسەکانی دا زۆری هەڵە تێدابوو ٥ گوتراوە (من كَثُرَ أهْذَرَ): کەسێك زۆر بڵێ هەڵە دەکا.

المِهْذارُ: کەسێکە لەقسەکانی زۆر وشەی هەڵەو نابەجێ هەبن ٥ گوتراوە (المِكثارُ مِهذارٌ) ٥ (ك: مهاذير).

الهَذْرُ: دەگوترێ: (لانذرو لاهَذرَ): نەکەم نەزۆر.

الهَذَرُ: قسەی بێماناو پڕو پوچ.

الهَذّارُ: کەسێك زۆر لەقسەکردن دا هەڵەبکا، قسەی نابەجێ لەدەم بێتەدەر.

الهَذِرُ: بەمانا (المِهذارُ)دێ.

هَذْرَمَ فلان: فلانکەس لەڕۆیشتن پەلەی کرد، خێرا ڕۆیی ٥ لەقسەکردن دا پەلەی کرد ٥ لەخوێندنەوە دا پەلەی کرد ٥ دەگوترێ: (هَذْرَمَ القرآن): بەپەلە قورئانی خوێندەوەو لەماناى وشەو رستەو ئایەتەکانی ورد نەبۆوە.

هَذْرم السيفُ: شمشێرەکە بڕی.

الهُذارِمُ والهُذارِمةُ والهِذْرامُ: زۆر بڵێ.

الهَذْرَمَى: شەڕەنگێزو ئاژاوەچی و چەقە چەناو.

هَذَفَ هُذُوفاً: پەلەی کرد ٥ (فهو هاذف).

الهاذِلُ: نیومشەو.

الهُذْلُولُ: پیاوی سوك و جەستە بچوك ٥ ئەسپی پشت درێژی زەعیفو لاواز ٥ شوێنی نزمایی لەساراى پان و پۆڕدا کەمرۆڤ نەگاتە سەرلێواری نزماییەکە هەستی پێ ناکا ٥ تیری بچوك ٥ گردۆڵکە ٥ بارانێك لەدورەوە ببینرێ ٥ جۆگەئاوی بچوك ٥ تەنکە هەور ٥ سەرەتای شەو یان کۆتایی شەو ٥ (ك: هذالِيلٌ) ٥ دەگوترێ: (ذهب ثوبه هذاليلٌ) قوماشەکە پارچە پارچە بوو.

**هَذْلَمَ:** لەرۆیشتنی دا خێرا خێرا هەنگاوی هەڵێنان بەڵام هەنگاوەکانی کورت بوون.

**هَذَمَ الشَيْئَ هَذْماً:** خێراشتەکەی بری.

**هَذَمَ الطعامَ:** خێراو بەپەلە خواردنەکەی خوارد.

**المِهذام:** شمشێری برندە.

**الهُذام:** شمشێری تیژ ٥ ئازاو نەترس ٥ دەگوترێ: (سِنان هُذام): نوکە رمبێکی تیژ ٥ (شفرة هُذام): کێردێکی تیژە خێرا شت دەبرێ.

**الهَيْذامُ:** ئازاو چاونەترس ٥ زۆر خۆر.

**الهُذامَة والهُذَمَةُ:** تیژو برندە ٥ دەگوترێ: (شفرة هذامة وهُذَمة): کێردێکی تیژو خێرا برە.

**الهَذُومُ:** دەگوترێ: (سکین هذوم): کێردێکی خێرا برو تیژە.

**الهَيْذَمُ:** خۆشرۆ ٥ خێرا ٥ گورج و گۆڵ.

**الهَذاهِذُ:** خۆ هەڵکێش و درۆزن، هەرکەسێک ببینێ دەڵێ ئەو خزمەمە یان ئیشی بۆ کردوم.

**الهُذاهِذُ:** دەگوترێ: (سیف هُذاهِذ): شمشێری تیژو برندە.

**الهُذْهَاذُ:** بەمانا (الهُذاهِذ)دێ.

**هَذاه بالسیف هَذْواً:** بەشمشێر بریەوە ٥ بری.

**هذى فلان هَذْياً وهَذَياناً:** ورێنەی کرد، قسەی بێ سەرو بەری گوتن ٥ بزرکاندی ٥ دەشگوترێ: (هذى فلان بالشيئ): فلانکەس لە ورێنەو بزرکاندنەکەی دا ئەوشتەی گوت.

**هاذاه:** هاوبەشی کرد لەورێنەکردن و بزرکاندن دا، لەوتەی ناشیرین و ناشایستەدا.

**تهاذى القومُ:** خەڵکەکە هەندێکیان قسەی ناشیرینیان بەهەندێکیان گوتن.

**الهُذاءُ:** ورێنەکردن بەقسەی غەڵەت و بێ مانا.

**الهَذيانُ:** تێکچوونی عەقڵ بەشێوەیەکی کاتی و بێ هۆشبوون و وەناگاهاتنەوە.

**هَرَأَ فلان في منطقه هَرْءاً:** فلانکەس زۆری قسەی هەڵەت و پەڵەت کردن.

**هَرَأَت الريحُ:** رەشەبایەکە سارد بوو.

**هَرَأَ البرد فلاناً هرءاً وهراءَةً:** سەرماکە لەسەر فلانکەس توند بوو تاگیانی دەرچواند، یان خەریک بوو بیکوژێ.

**هَرَأَ فلانٌ اللَّحْمَ:** فلانکەس گۆشتەکەی باش برژاند باشی کوڵاند.

**هَرِئَ اللَّحمُ هَرْءاً وهُرْءاً:** گۆشتەکە باشباش برژا.

**هُرِئَ المالُ والقومُ:** ماڵ و سامانەکە هەروا خاوەن ماڵەکان سەرماو گەرما

لەناوی بردن ٥ (فهم مَهْرؤون).

أهْرَ القومُ في الرواح: خەڵکەکە ئێوارە سەرمایان بوو.

أهْرَأ فلاناً: فلانکەسی کوشت.

أهْـرَأ الـبردُ فلانـاً: سـەرما لەسـەر فلانکەس توند بوو تاکوشتی یان خەریك بوو بیکوژێ.

أهْـرَأ الكـلام وفيـه: زۆری قـسەکردو قسەکانی مەبەستیان نەپێکا.

أهْـرَ اللحـمَ: گۆشـتەکەی زۆر کولانـد زۆری برژاند.

هَرَأ اللحمَ: گۆشتەکەی زۆر کولاند.

تَهَرَّأ اللَّحْمُ: گۆشتەکە زۆر کوڵی تاوای لێ هات لەئێسقانەکە کەوتە خوار.

تَهَـرَّأت الماشـيةُ: ئاژەڵـەکان بەسـەر فەوتان و لەناوچون.

الهُـراءُ: ئاخـاوتنی بـێ سـەرو بـەرە، هەڵـەت و پـڕو پـوچ ٥ دەگـوترێ: (رجـلٌ هُـراء): پیاوێـکە قـسەکانی هیچیان بەسەر هیچەوە نییە.

الهِراءُ: نەمامی درەختی خورما.

الهُرَاءُ: بەمانا (الهُراءُ)دێ.

الهَـرَاءة: ئافرەتێـك ئاخاوتنـەکانی بـێ سەرو بەربن.

الهَـرِيءُ: گۆشـتی چـاك و بـاش کـوڵاو ئامـادەکراو بـۆ خـواردن بەجۆرێـك ئەوەنـدە کوڵێنـدرابێ ئێـسقانی بەردابێ.

الهَرِيئة: ئەوکاتـەی سـەرما لـە خـەڵك و مـاڵ و سـامان دداو زیانیـان پـێ دەگەیەنێ.

هَرَبَ هَرَباً وهروباً: هەڵات، رای کرد.

هَرَبَ دَمُهُ: زۆر ترسا.

هَـرَبَ نـصف الوتـد في الأرض: نیـوەی سینگەکە بەزەوی دا رۆچوو.

هَـرِبَ فـلان هَرَبـاً: فلانکـەس پـیر بـوو (لۆغەتێـکە لە هَرِمَ).

اهْـرَبَ فـلانٌ: فلانکـەس پەلـەی کـرد لەرۆیشتن دا، رۆیی بەترسەوە.

أهْرَبَ في الأرض: دوور کەوتەوە.

أهْـربَ في الـرأي: چـووە قـوڵایی راو بۆچوونەکەوە ٥ دەشگوترێ: (جـاء فلان مُهْرِباً): فلان هات زۆر سوربوو لەسەر کارەکە.

أهْرَبَ: پەلەی کرد ٥ بەگورجی رۆیی.

أهْرَبَـت الـريحُ مـاعلى وجـه الأرض: رەشەبایەکە چی لەسەر روی زەوی بوو رای دا.

أهْرَبَ فلاناً: فلانکەسی ناچارکرد هەڵێ ٥ رابکا.

هَـرَّبَ فلانـاً: وای لـێکرد هـەڵێ، بقاچێنێ، رابکا.

هَـرَّبَ البِـضَاعة الممنوعـة: ماڵـە قاچـاخەکەی لەولاتێـکەوە بـردە

ولاتێکی تر، بەقاچاغی داخلی کرد.

المَهْـــرَبُ: مالّمــالّ، دارێـــکە وەرزێـــرو کشتیار زەوی کێلّدراوی پێ تـەخت دەکەن.

المَهْـــرَبُ: هـــەلاّتن ٥ پـــەناو شـــوێنی خۆلێحەشاردان ٥ دەگـوترێ: (فـلان مَهْـــرَب لنـــا): فلاّنکـــەس پـــەنای ئێمەیە.

المُهَـرِّبُ: قاچاغـچی کـەتاوانی کـالا ئـەو دیـوکردن‌و ئەمـدیوکردن ئـەنجام دەدا.

هـــرِبَجَ العَمَـــلَ: ئیـشەکەی بەناڕێـــك‌و پێکی ئەنجام دا.

هرِبَذ: رۆیشت بەرۆیشتنێکی وا نەگاتە ئەندازەی غاردان.

الهِرْبِـــذُ: پیـــاوی ئـــاییني زەردەشـــتی کەسەرپەرشـتی ئاتەشـکەدە دەکـا ٥ وشەکە فارسییەو کراوە بەعەرەبی.

الهِرْبِـــذِيُ: جـــۆرە رۆیـــشتنێکە لارو لەنجەی تێدایە ٥ رۆیشتنی حوشترو ئـاژەڵ‌و ولاّخـی تـر کاتـێ لەسـەر لا دەڕوا.

الهُرْبُـــعُ: سـوك‌و گـورج‌و گـۆڵ ٥ دزی گورج‌و گۆڵ گورگی گورج‌و گۆڵ ٥ (ك: هرابع).

هَـــرَتَ الـــشَيْءَ: شـتەکەی دڕی بۆنـەوەی فراوان بێ ٥ دەگوترێ: (هَـرَتَ ثوبَـهُ): کراسەکەی دادڕی بۆنەوەی فراوان بێ.

هَـــرَتَ شِـدْقَهُ: لاشـەویلەی راکێـشا بـۆلای گوێچکەی.

هَرَتَ فلاناً بالرمح: بەشمشێر لـەفلاّنی دا ٥ دەگـوترێ: (هَـــرَتَ عِرْضَـــهُ): تانـەی لەناموسی دا لەکەداری کرد.

هَـــرَتَ اللحـمَ: گۆشـتەکەی بـاش کولاّنـد ٥ (فهو هريت).

هَرِتَ الرجلُ وغيره هَرَتاً: پیاوەکە شەویلەی پـان بـوو ٥ دەگـوترێ: (هـــو أهـــرت الشِدْقِ) یان (هريت الشِدْق).

أهْرَتَ اللحمَ: گۆشتەکەی چاك کولاّند.

هَـرَّتَ شِـدْقَهُ: شـەویلەی فـراوان کـرد، لێـکی کێشایەوە.

تهارت: دەمی کردەوەو زۆری قسەکرد.

الهريت (ثوب هريت): کراسێـکی دڕاوو ونجڕ ونجڕ کـراوە ٥ (عِرض هريت): ناموسـی تانـە لێـدراو ٥ (رجـــل هریـــت): پیاوێـــکە نهێنـــی بـــۆ ناپـــارێزرێ‌و قـــسەی ناشـــیرین‌و نەشیاو دەکا.

الهَرْكَمَةُ: شێر ٥ سەری لـوت ٥ رەشـایی نێوان کەلّبی سەگ.

هَـــرَجَ في الحـــديث هَرْجـــاً: درێـــژەی بەقـسەکردنەکە داو قـسەی تێـکەڵ‌و پێکەڵ کردن.

هَرَجَ القومُ: خەڵکەکە کەوتنە ناو ئـاژاوەو

ناشوبو کوشتنو بگرەو بەردەوە.

**هَرَجَ الفرسُ:** ئەسپەکە بەگورجی بازی هاویشت ٥ (فهو هراج ومِهراج).

**هَرَجَ الرجلُ في الأمر:** پیاوەکە لەکارەکەدا کەوتە شكو گومانەوەو بڕوای بەواقیعەکە نەکرد.

**هَرَجَ البابَ:** دەرگاکەی بەکراوەیی جێ هێشت.

**هَرَجَ النومَ:** زۆر نوست.

**هَـرِجَ البعيرُ ونحوه:** حوشترەکە لەبەر زۆری گەرما یان باری قورس چاوی لێڵو پێڵ بوون ٥ دەشگوترێ: (هَـرِجَ الرجـلُ): پیاوەکە چاوی لێڵو پێڵ بوون لەبەر زۆری گەرما یان زۆر ڕۆیشتن.

**أَهْـرَجَ الرجلُ:** پیاوەکە حوشترەکەی بەهۆی گەرمای زۆر یان باری گران چاوی لێڵو پێڵ بوون.

**أَهْرَجَ البعيرَ ونحوه:** بەگەرمای نیوەڕۆ حوشترەکەی تاودا تا چاوی لێڵو پێڵ بوون.

**هَرَّجَ:** هەراو هۆریای بەرپاکردو کێشەو نیزاعی نایەوە.

**هَـرَّجَ بالأسد:** هەرای لەشێرەکە کرد هەلهەلەی لێ کێشا بۆئەوەی دەری بکا.

**هَـرَجَ البعيرَ:** بەگەرمای نیوەڕۆ حوشترەکەی تاودا تا چاوی لێڵو پێڵ بوون.

**هَرَّجَ الخمرُ فلاناً:** عەرەقەکە فلانکەسی سەرخۆش کرد، هاواری کرد پێکەنی، حاڵو وەزعی شێواند.

**إنْهَرَجَ فلان من الخمر:** پیاوەکە لەناکامی عەرەق خواردنەوەدا هێزو توانای نەماو کەوتە لارە لارو گۆدە گۆد.

**اسْتَهْرَجَ الرأيَ لفلان:** راو بۆچونی بۆ فلانکەس بەهێزو فراوان بوو.

**المُهَـرِّجُ:** پڕوپاگەندەکارو زمانلوس بۆ بانگەشەو پیاهەڵدانو بڵاوکردنەوەی شتی پڕو پوچ ٥ کەسێك بەقسەی سەیرو هەڵوێستی تایبەتیو لاسایی کردنەوە خەڵك وەپێکەنین بێنێ.

**الهَرْجُ:** زۆرینەی شت ٥ فیتنەو ئاشوبو تێکچڕژان ٥ دەگوترێ: (أصبح القومُ في هَـرج ومَـرْجٍ) ٥ گەرمەی شەڕو زۆری کوژراو ٥ زڕە خەون، خەونی پڕو پوچ.

**الهِـرْجُ:** دڕاو شەقبوو ٥ زەبون لەهەرشتێك بێ.

**الهِرْجَةُ:** کەوانی نەرم ٥ (ك: هِرَجُ).

**الهَرَّاجَةُ:** کۆمەڵێك خەڵق کەبەقسەی درۆو پڕوپاگەندە شت هەڵدەکێشنو بانگەشەی بۆدەکەن.

هَرْجَلَ فلان هرجَلَةً وهِرْجالاً: فلانكەس رۆیشتنەکەی تێکەڵو پێکەڵ بوو هەندێکی گورگە لوقەو هەندێکی ئاسایی بوو.

هَرْجَلَ في أعمالـه: ئیشەکەی رێكو پێك نەبوو تەرتیبو نەزمی تێدانەبوو.

الهُرْجُلُ: هەنگاو درێژ ◦ (ك: هراجِلُ).

الهُرْجُولُ: مرۆڤی درێژ ◦ حوشتری گەورەو زەبەللاح ◦ (ك: هراجیل).

هَرَدَ الناس هَرْداً: خەڵکەکە تێکەڵاو بوون تێك چرژان.

هَرَدَ الثَّوبَ: کراسەکەی دڕی، ونجڕ ونجڕی کرد ◦ بەڕوەکی وەرس ڕەنگی کرد.

هَرَدَ اللحمَ: گۆشتەکەی زۆر کوڵاند.

هَرَدَ العِرْضَ: تانەی لەناموسی دا.

هَرِدَ اللَّحْمُ هَرَداً: گۆشتەکە هەڵوەری، رزی.

هَرِدَ شِدْقُهُ: شەویلەی پانو فراوان بوو ◦ (فهو أهْرَدُ).

هَرَّدَ فلان: فلانکەس پۆشاکی ڕەنگکراو بەوەرسی پۆشی.

هَرَّدَ اللَّحمَ أو الثوبَ: گۆشتەکەی زۆر کوڵاند یان کراسەکەی زۆر دڕی ◦ ونجڕ ونجڕی کرد ◦ دەشگوترێ: (هَرَّدَ الثوب): کراسەکەی بەڕەنگی وەرس ڕەنگ کرد.

الهِرْدُ: نوعامه ◦ پیاوی خوێڕی.

الهُرْدُ: گیا کورکوم.

الهُرْدِيُّ: شتی ڕەنگ کراو بەڕەنگی وەرس.

هَرْدَبَ: بازێکی گەورەی هاویشت.

الهِرْدَبُ: ترسنۆكو کەتەو بێ عەقڵ.

الهِرْدَبَّةُ: بەمانا (الهِرْدَبُ)دێ ◦ پیاوی کەتەی زەبەللاحی درێژو چەتاوڵ ◦ پیرەمێرد.

هَرَّ هَرّاً: بۆڵە ترێی هەڵوەریوی خوارد.

هَرَّ الشَّوْكُ: چقڵەکە وشك بوو هیچ تەڕایی تێدا نەما ◦ بەجۆرێك لەوەڕ خۆر خۆی لێ بوارد نەیخوارد.

هَرَّ سَلْحُهُ: سکی چوو تا گیانی دەرچوو.

هُرَّ الدَواءُ سَلْحَهُ: دەرمانەکە سکی ڕەوان کرد.

هَرَّ القوسُ هريراً: کەوانەکە دەنگی لێ هات.

هَرَّ فلان في وجه السائل هراً: فلانکەس بەڕو گرژی سوالکەرەکەی بەڕێ کرد لێی تورە بوو.

هَرَّ الكلبُ: سەگەکە لوراندی، وەڕی دەمی داپچڕیو کەڵبەی دەرخستن.

هَرَّ اليه: وەڕی بەبێ لوراندن هەر عەفعەفی بوو.

هَرَّ الناسُ فلاناً: خەڵك لای فلانیان پێ

ناخۆش بوو، حەزیان لەچارەی نەبوو.
**هَرَّ البَرْدُ الكلبَ:** سەرما وای لەسەگەکە کرد بلورێنێ.
**هَرَّ الشَیْئُ:** شتەکەی ناخۆش ویست.
**هَرَّ فلان هَرّاً:** فلانکەس رەوشتی ناشیرین بوو.
**هُرَّت الإبِلُ:** حوشترەکە توشی نەخۆشی هەوکردنی نێوان پێستو گۆشت بووە.
**أهَرَّ فلان الغنم:** فلانکەس مەڕو بزنەکانی بردنە سەرئاو.
**أهَرَّ البردُ الكلبَ:** سەرما سەگەکەی هێناوەتە وەڕین ٥ لەپەند دا هاتووە دەڵێ: (شرٌّ أهَرَّ ذاناب): ئەم پەندە بۆ حاڵەتێك دەگوترێ کە تارمایی شەڕو نەگبەتی لەئاسۆوە دەرکەوتبێ.
**هَارَّهُ:** بەڕوویا تەقییەوەو لێی تورە بوو، پێیدا هەڵشاخی.
**الهُرارُ:** دەردێکە توشی حوشتر دەبێ وەکوو هاوسان دەکەوێتە نێوان پێستو گۆشتییەوە ٥ دەردێکە توشی حوشتر دەبێ گوفیرەی پێ دەگرێ دەتورێنێ.
**الهِـرُّ:** پشیلە ٥ (ك: هِـرَرَة). (الهِـرَّة) پشیلەی مێ ٥ لێخوڕینی مەڕو بزن.
**الهُرُّ:** شێر کە دەنگی رۆیشتنی دێ ٥ ئاوو شیری زۆر.
**الهَرَارُ:** سەگ کە کەڵبەکانی دەردەخاو دەم دەکاتەوە ٥ بێ عەقڵو کاڵفام.
**الهَرّاران:** دو ئەستێرەن یەکیان ناوی (النسر الواقع)ە ئەوی تریان ناوی (قلب العقرب)ە، دەڵێن کە هەڵاتنی ئەوان کەوتە بەرشەو دونیا زۆر سارد دەبێ.
**الهَـرُورُ:** ئەو بۆڵە ترێو دەنکە مێوژانەیە کە لەهێشووە ترێ دەکەونە خوار.
**الهَرِيرُ:** وەڕەی سەگ بەلورەو قروسکە.
**الهَرِيرةُ:** پێ ناخۆش بوون ٥ گرژیو مۆنی ٥ دەگوترێ: (أجدُ في وجههِ هريرة): لەدەمو چاوی دا گرژییەك دەبینم.
**هَرْوَزَ الحيوانُ:** ئاژەڵەکە مرداربۆوە.
**تهَروَزَ من الجوع:** لەبرسا مرد.
**هَـرَسَ الـشَیْئَ هرساً:** شتەکەی کوتا ٥ بەشتێکی پان شتەکەی پەستاوت ٥ زۆری کوتا.
**هَـرَسَ الطعـامَ:** بەخێرایی‌و پەلە پەل خواردنەکەی خوارد.
**هَرِسَ الرجلُ هَرَساً:** پیاوەکە نەوسنو زۆر خۆر بوو ٥ بەنهێنی نانی خوارد.
**المِهْـراسُ:** حوشتری زۆر خۆر ٥ حوشتری کەتەو زەبەلاح ٥ پیاوێك

لەشـــەوو شـــەو ڕەوی نەترســێ ٥ هــاوەنو ســندوڵ کەشـتیان تێـدا دەکـوترێ ٥ بەردێـکە حەوزێـکی لاکێـشەیی لـێ هەڵدەکەنـدرێ بـۆ دەسـتنوێژ گـرتنو شـتی وا ٥ ئـەو کوتکــە دارەی گــەنمو چــەڵتوكو شتی وای پێ دەکوترێ.

الهَراسُ: درەختێـکی گەورەیـە لـەپێڕی (القرنیـــة)یـــە لـــەولاتی میـــصرو حەبەشەو سەنیغال دەڕوێ، توێکڵی سپی یان خاکییە ٥ لەولاتی سودان پێی دەگوترێ: (الخُزامی).

الهُرَاسَةُ: دوژمن شکێن ٥ دەگوترێ: (بنو فـلان ذو هراســة): خـاوەنی نـەردو نگــینو دەســەلاتن دوژمــن تــارو ماردەکەن.

الهَرّاسُ: ئەوکەسەی کەشکەك دروست دەکا ٥ هەریسە لـێ دەنێ ٥ هەریسە فرۆش ٥ ئەوسنو زۆر خۆر.

الهَرْسُ: پشیلە.

الهَـرِسُ: بـەمانا (الهُـرَاسُ)دێ ٥ بـەمانا (الهَرْسُ)دێ ٥ هەروا بـەمانا پۆشاکی رزیوو بێ کەڵك دێ.

الهَـریسُ: گەنمـە کوتـاو پـێش ئـەوەی بکوڵێنـدرێ.

الهَریـسَة: کەشـکەك، کێـشتی هەریـسە گەنمــە کوتــاو گۆشــتی زۆری تــێ دەکرێ ٥ جۆرە حەڵوایەکە لـەئاردو ڕۆنو شــەکر دروســت دەکــرێ ٥ (أرض هریـــسة): خــاكو ولاتێــکە درەختی هەراسی زۆر لـێ بڕوێ.

هَـرَشَ الـدهرُ هَرْشـاً: ڕۆژگـار نـاخۆشو پڕچورتم بوو.

هَارَشَ الکلبُ الکلبَ ونحوه: سەگەکە شەرە سەگی کرد لەگەڵ سەگەکەی تر.

هارَشَ الرجلُ بعض الکلاب علی بعض: پیاوەکـــە هەنـــدێ لەســـەگەکانی بەردایـە هەندێـکی تریـان (شـەڕە ســەگی پێــکردن) هــەڵێنان بــۆ شەڕکردن.

هَرُشَ فـلان هَرَشـاً: فلانکەس ڕەوشـتی ناشیرین بوو.

هَرَّشَ بین الناس: فیتنەو ئاشوبی خستە ناو خەڵکەوە.

اهترشـت الکـلابُ أو الدیکـة او نحوهـا: سەگەکان شەڕیان بوو.

تهارشت الکلاب: بەمانا (اهترشـت)دێ ٥ دەشـگوترێ: (تهـــارش القـــومُ): خەڵکەکە بوو بەشەڕو هەرایان.

تهرّش الغیمُ: هەورەکە لاچوو بـوو بـە هەساو.

مُهـارِشٌ: دەگـوترێ: (فـرس مُهـارش): ئەسپێکی گورجو گۆڵو سەرنەرمە.

الهَرِشُ: مرۆڤی گێلی وشك تەبیات.

هَرْشَفَ الشَيْئُ: شتەكە وشك بوو.

تَهَرْشَفَ: كەم كەم ئاوەكەی خواردەوە.

الهِرْشَفَةُ: پارچە پەڕۆیەكە ئاوی پێ وشك دەكرێتەوە ٥ لیقەو پەڕۆی ئاو قوتوەوە مەرەكەب كەوشك دەبێتەوە.

الهِرْشَمُ: بەردی نەرم ٥ كێوو شاخی هەڵۆڵو كونكون ٥ كەڑی بچكۆلەی ئاودار.

الهِرْشِن: شەویلە پان.

هَرِصَ هَرَصاً: گرویێی وشكی توشبوو.

هَرَّش: جەستەی بە گرویێی داوەشا.

الهَرِيصَةُ: زەلكاو.

الهَرَصُ: گرویێی وشك لەجەستەدا.

هَـرَضَ الثـوبَ: قوماشـەكەی ونجڕ ونجڕ كرد.

هَرَطَ في الكلام هَرَطاً: قسەی تێكەڵاو كردنو زۆری شتی بێ كەڵكو پڕو پوچ هەڵڕشت.

هَـرَطَ عِـرْض أخيـه: تانـەو تەشـەری لەناموسو كەسایەتی براكەی دا.

هَرِطَ الرجلُ هَرَطاً: فلانكەس گۆشتی شل بوو، داچۆڕا دوای ئـەوەی گۆشـتی توندو پتەو بوو، جاشل بوونی گۆشـتەكەی بـەهۆی نەخۆشـی یـان ترسو بیمەوە بێ.

تهارط الخصمان: دوكەسە بەكێشە هاتووەكە جنێویان بەیەك دا.

الهَـرْط: گۆشـتی كـزو شـلو لیـنج كەوەكوو چڵم وابێ ٥ گۆشتێـك كـە كوڵێندرا وردو هاڕببێ.

الهِـرْطَ: گۆشـتی كـزو لاوازی لیـنج وەكوو چڵم ٥ ئاژەڵی گەورەو كەتـە ٥ پیـاوی دەوڵەمەنـد ٥ (ك: أهـراط وهروط).

الهِرْطَـةُ: گێلو ئەحمەقو ترسنۆك ٥ (ك: هِرَطٌ).

الهَيْرَطُ: نەرمو لینج.

الهَرْطالُ: پیاوی درێژی جەستە گەورەو كەتە.

الهُرْطمانُ: رووەكی شۆفان ٥ خەرتەلە.

هَرِعَ الـدمُ هَرَعـاً: خوێنەكە رژا ٥ ڕەوان بوو.

هَرِعَ فلان: فلانكەس بەخێرایی رۆیی.

هَرِعَ الصَّبِيُّ: منداڵەكە خێرا گریا ٥ (فهو هـرِع وهـي هَرِعـة): یـان بـازی دا ٥ قورئـان دەفـەرموێ: (وجـاءه قومـه يهرعون اليه).

أهْـرَعَ الرجُـلُ: پیاوەكـە بەپەشـۆكاوی رۆیی یان بازی دا.

أهْـرَعَ القـومُ الرمـاحَ: خەڵكەكـە رمبەكانیان بەرز كردنەوەو رۆیشتن بۆ بەرەنگاریی.

أهْرِعَ الرجلُ: پیاوەکە بەشل‌و شێواوی ڕۆیی ٥ پیاوەکە لەڕقا یان لەترسا یان بەهۆی لەرزو تاوە کەوتە لەرزین ٥ کاڵفام‌و عەقڵ سوك بوو ٥ (فهو مُهْرَع).

هَرَّعَ القوم رِماحَهم وبها: خەڵکەکە ڕمبەکانیان بەرز کردەوەو بەرەو دوژمن ڕۆیشتن.

اهْتَرَعَ والعودَ: کەمانەکەی شکاند ٥ یان شورکە دارەکەی شکاند.

تَهَرَّعَ الرِماحُ: خەڵکەکە ڕمب بەدەستەوە هاتن.

المُهَرَّعُ: سوور بوو لەسەر شت.

المَهْرُوعُ: کەسێك لەناکامی هیلاکی‌و ماندویتی بمرێ.

الهُراعُ: ڕۆیشتن بەشێوەی پەشۆکاوی‌و خێرایی ٥ خێرا لێخوڕین ٥ خێرا بازدان.

الهَرَعُ: بەمانا (الهُراعُ)دێ.

الهِرْيَاعُ: گەڵای ومریو بەهۆی ڕەشەباوە.

الهَريعَة: درەختۆکەی لق‌و پۆپ باریك‌و بچوك.

الهَيْرَعُ: ترسنۆك‌و لاوازو بێ خێر ٥ بای خێرا ڕۆو تەپو تۆز بەرپاکەر ٥ ئافرەتی قیزە قیزکەرو جرپن‌و گورج.

الهَيْرَعَةُ: شمشاڵ‌و بلوێری شوان ٥ خێوی بیابان.

هَرَفَ الرجلُ هَرْفاً: پیاوەکە چەنەی دا قسەی وڕێنەو بێ مانای کردن ٥ دەگوترێ: (فلان يَهْرِفُ بمالا يعرف): پیاوەکە چەنەی دا قسەی وڕێنەو بێ مانای کردن ٥ دەگوترێ: (فلان يَهْرِفُ بمالايعرفه): فلانکەس نازانێ چی دەڵێ.

هَرَّفَ بفلان: زیاد لەحەد مەدحی فلانی کرد زۆر زێدە ڕۆیی کرد لەوەسف‌و پێداهەڵگوتن دا.

هَرَفَ السبعُ: دڕندەکە گوێ قولاخی دەنگەکە بوو.

هَرَفَتْ الريحُ فلاناً: ڕەشەبایەکە فلانکەسی سوك کرد وای لێ کرد خێرا بڕوا.

أهْرَفَ الرجلُ: پیاوەکە ماڵ‌و سامانی زیادی کرد.

أهرفَتْ النخلةُ: دارخورماکە زوو میوەکەی پێ گەیاند.

الهَرْفُ: هەرشتێك زوو پێ بگا لەمیوەو شتی وا.

هَرَقَ الماءُ ونحوه هَرْقاً: ئاوەکەی هەڵڕژاندە ناوی.

أهْرَقَ الماءَ: ئاوەکەی ڕشت.

هَرَّقَ: دەگوترێ: (هَرِّق على جَمْرِك): ئاو بڕژێنە بەسەر ئاگرەکەت دا

واته پشو درێژبەو خۆڕاگرە لەسەر کارەساتەکە.

تهارق القوم: خەڵکەکە شەڕە ئاویان کرد ٥ ئاویان بەسەریەك دا کرد ٥ شەڕیان کردو خوێنی یەکتریان ڕشت.

إهْرَوْرَقَ الماءُ أو الدم: ئاوەکە جاری بوو، ڕەوان بوو.

المُهْرَقُ: پەڕەی سپی کەلەسەری دەنووسرێ ٥ پارچە چنراوێکە لەئاوریشمی سپی صەمغی تێ هەڵدەسووریو سفتو لوس دەکرێو ئەمجار لەسەری دەنووسرێ ٥ ئامێرێکە لەشووشەو شتی وا پۆشاکی پێ سفتو لوس دەکرێ ٥ سارای روتەنو سوتەمەڕۆ ٥ کاغەزی سفتو لوسی سەمغ لێ دراو کەلەبواری چاپەمەنی دا بەکاردێ.

المَهْرَقان: دەریایەکە سەرریژ دەکاو شەپۆل دەهاوێ ٥ ئەوشوێنەی ئاوی دەریای لێ دەرژێتە ناوچاڵو چۆڵی دەورو بەری.

المُهْرَقان: بەمانا (المَهْرقان)دێ.

الهِرْقُ: پۆشاكو قوماشی ڕزیوو کۆن.

الهِرْقِلُ: بێزنگ ٥ (ثیاب هِرْقِلیّة): پۆشاکی ڕزیو.

هِرَقل وهِرْقِل: ناوی مەلیکی رۆمە.

هَرْكَل الرجلُ: پیاوەکە بەلارو لەنجە ڕۆیی‌و بەحاڵ پێی لەزەوی دەناو هێواش هەنگاوی هەڵدێنایەوە.

الهُراكِلُ: پیاوی کەتەو زەلام، یان ئاژەڵی گەورەو جەستە زەبەلاح.

الهَراكِلَةُ: شوێنی کۆبونەوەی شەپۆلەکانی ئاو ٥ سەگی ئاوی ٥ گیانلەبەری دەریایی گەورەو زەبەلاح ٥ ماسی زۆر زل.

الهَرْكَلَة والهِرْكَلَةُ: جەستە جوانو شۆخو شەنگ.

الهِرْكولة من النساء: ئافرەتی کەفەڵ پانو زل ٥ یان ئافرەتی جوان.

هَرْوَلَ: گورگە لۆقەی کرد ٥ بە نەرمەغار رۆیشت.

الهَرَلُ: کۆڵە بەسە ٥ منداڵی ژن لەمێردێکی تری.

هَرَمَتِ الإبلُ هَرْماً: حوشترەکە درەختی هەرمێ خوارد.

هَرِمَ الرجلُ: پیاوەکە تەمەنی درێژ بوو گەییشتە حاڵەتی کەنەفتی پیر بوو زەعیفو لاواز بوو.

أهْرَمَ الدهرُ فلاناً: رۆژگار فلانی کەنەفتو لاواز کرد.

هَرَّمَ الدهرُ فلاناً: رۆژگار فلانی کەنەفتو زەبون کرد.

هَرَّمَ فلان اللحمَ: فلانكەس گۆشتەكەی پارچە پارچە كرد ٥ كوتكوتی كرد.

هَرَّمَ الامْرَ: كارەكەی بەگرنگو گەورە نیشان دا زیاد لەحەقی دایەو زێدە رۆیی كرد لەوەسپ دانی دا.

هَـرَّمَ البنـاءَ: باڵەخانەكـەی لەسـەر شێوەی هەرەم بیناكرد.

تهارَمَ فـلان: فلانكـەس خـۆی بـەپیرو كەنەفت دانا وەلێ وانەبوو.

الهَرْمُ: جۆرە بەرەدارێكی ترشەو كەمی سوێری هەیە.

الهَرَمُ: باڵەخانەیەكی گەورەو فراوانە یەكێ لەفیرعەونەكانی میسر بنیاتی ناوە، لەبەردی گەورەو راستەو پاشتەكراو بنیات نراوە، بۆیە دروستی كردووە كەمرد تێیدا بنێژرێ زۆربەیان بناغەكەیان چوار دیواری شێوە سێ سوچە، ئەم دیوارانە بۆ حەوا بەرزبوونەوەو وردە وردەوێك هاتوونەوە تا لەناكاما سەری دیوارەكان گەییشتونەوەیەكو بوونە یەك سوچی تیژو سەری هەرەمەكەی پێك هێناوە ٥ (ك: أهرام).

الهَـرَمُ المُـدَرَّجُ: جـۆرە هەرەمێكە دیوارەكانی لە سەكۆی یەك لەسەریەك پێك دێ ٥ هەرەمی (سقارة المدرّج): كۆنترین بینای گەورەو بەرزو فراوانە لە مێژوو دا كە بەبەرد دروست كرابێ.

الهَرِمُ: پیری كەنەفت؛ كەبگاتە تەمەنی رەزیلیو زەلیلی ٥ عەقڵ ٥ نەفس ٥ دەگوترێ: (لا أدري بمَ يُولع هَرِمُـك؟): نازانم نەفست عاشقی چی بووە؟ ٥ رای پەسەندو بەئەزمون ٥ پیاڵەی كەل بوو ٥ قاپو زەرفێك كەلی تێكەوت بێ.

الهَرْمى: داری وشك، قەلاشكەری.

الهُرْمان: عەقڵو ئاوەز ٥ رای پەسەند.

الهَرْمَةُ: دوامنداڵی پیرەمێردو پیرەژن ٥ پێچەوانەی نۆبەرە.

الهَرِمَةُ: دێڵە شێر.

الهَـرُومُ: ئافرەتی بەدخوو رەوشت ناشیرین.

هَرْمَزَ الرجلُ: قسەی بەئەسپایی كرد بەجۆرێك هاوەڵەكەی گوێی لێنەبێ ٥ پیاوەكە پاروی لەدەمی دا هێناو بردو قوتی نەدا.

هُرْمُزْ: وشەیەكی فارسییە كراوە بەعەرەبی ٥ لەلای فارسەكان ناوی خودایەكیانە ٥ ناوی ئەستێرەی موشتەرییە ٥ ناوی یەكێكە لەپاشاكانیان سالی (٢٧٢ ز)ی مردووە ٥ عەرەب وشەی (الهرمز

والهارموز والهُرمزات)یان داناوه بۆ شاهەنشای فارس.

هَرْمَسَ الرجلُ: پیاوەکە روی گرژ بوو.

هَــرْمَسَ النـــاسُ: خەلکەکـە وروژان‌و کەوتنە تەحا تەحاو هاتوو چۆ.

الهُــرامِسُ: شـێری ئـازاو بەهەلّمـەت‌و پەلامەر دەری مرۆڤ.

الهِرْمــــاسُ: بـــەمانا (الهُـــرامِس)دێ ٥ بێچوی پلّنگ.

الهِرْمُـــوس: راپەســـەندو ســوور بـــوو لەسەر هەلّوێستی خۆی.

الهِـــرْميسُ: بـــەمانا (الهَـــرَامِسُ) دێ ٥ کەرکەدەن.

الهِرْميـــسَةُ: مێینـەی دوراجـە؛ جـۆرە بالّندەیەکە وەکوو کەو.

هَـرْمَطَ الرجـلُ عـرض فـلان: پیاوەکـە تانـــەو تەشـــەری لـــەناموس‌و کەسایەتی فلاّنکەس دا.

إهْرَمَّـعَ الرجـلُ: پیاوەکە لەڕۆیـشتن دا پەلـەی کـرد ٥ خێـرا ڕۆیـی ٥ خێـرا گریا، زوو فرمێسکی هاتنە خوار.

إهْرَمَّعَ في منطقة وحديثه: زۆر رۆچووە ناو قسەوە.

إهْرَمَّعَ اليـه: خـۆی بـەگرینۆك خـستە بەرچاو ٥ گریانی هێنایە خۆی.

هَرْملتِ العجوز: پیرێژنەکە زۆر چووە سالّەوەو کەنەفت بوو.

هَرْمَـــلَ الـــوبرُ: کـــولّکی حوشـــترەکە هەلّوەری، روتایەوە.

هَرْمَلَ الرجلُ الشَّعْرَ: پیاوەکە مووەکانی هەلّکێشان، بڕینی.

هَرْمَلَ الرجُلَ: موی پیاوەکەی مـوکێش کردن، مووە کانی هەلّکەندن.

هَرْمَلَ عَمَلَهُ: کردەوەکەی پوچ کردەوە.

الهِرْمِــــلُ: حوشــتری پــیر ٥ ئــافرەتی جەستە نارێـك‌و پێـك‌و شپرێو.

الهُرْمُـــولُ: پارچـە مـو؛ تۆپەلّـە مـو بەسەرەوە بمێنێتەوە.

الهُرْمُــونُ: هۆرمـۆن؛ مادەیەکـە بـڕێ غـــودە لـــەخوێن دا دەری دەدەن جەستە بەهۆیەوە هەسـتیار دەبـێ‌و نیـــشاتی زیـــاد دەکـــا ٥ بۆنمونـــە هۆرمۆنی جوتە گون.

هَرْنَـــفَ الرجـــلُ: پیاوەکـــە پێـــکەنی بەهێواشی.

هَرْنَفَــتْ المـرأةُ: ئافرەتەکـە بەهێواشـی گریاو بەنەسپایی قسەی کرد.

هَرْهَرَ الشَّيْئُ: شتەکە دەنگی پەیدا کرد هـارە هـاڕی لـێ هـات ٥ دەگـوترێ: (هَرْهَرَتْ الريحُ): ڕەشـەبایەکە هـاژە هاژی هات.

هَرْهَرَ الضأن: مەڕەکە باڕاندی.

هَرْهَرَ الأسدُ: شێرەکە نەڕاندی.

هَرْهَـرَ الرجـلُ: پیاوەکـە بەمەبەسـتی

گاڵتــــەکردن بەحــــەق لــــەقاقای پێکەنینی دا.

هَرْهَرَ بالغنم: دەنگی مەڕو بزنەکانی دا بۆنــەوەی بــچن بــۆ ســەرئاوەکەو ئاوبخۆنەوە.

هَرْهَرَ اللّبَنُ: شیرەکە لەکاتی دۆشینی دا خوشەی هات.

هَرْهَرَ الشَّيْئَ: شتەکەی جوڵاند.

تهرهرتْ الريحُ: بایەکە هاژەی هات.

الهُراهِرُ: شێرێك زۆر بنەرێنیٔ ٥ ئـاوی زۆر یان شیری زۆر.

الهَرْهَـــــارُ: کەسێـــك بەمەبەســـتی گاڵتەکردن بەحەق‌و راستی زۆر پیٔ بکەنیٔ‌و گاڵتە بەنایین بکا ٥ گۆشتی فەڵەو ٥ شێر.

الهُرْهُـــورُ: ئــەو بۆڵــەترێ‌و مێـــوژە وشــــکەڵانەی لەهێـــشوە تــــرێ بەردەبنـــــەوە دەکەونــــە ژێــــر دارمێوەکە ٥ جۆرە کەشتییەکە.

هُرَاهُ هَرْواً: بەقامچی ئەستور لێی دا.

هَرّى ثوبَـهُ: کراسەکەی بـەرەنگی زەرد رەنگ کرد.

تَهَرّاه: بەمانا (هَرَاهُ)دێ.

الهُراءُ: وڕێنە.

الهِراءُ: ئەمامە خورمـا ٥ سـەخی‌و نـان بدە.

الهِـراوَةُ: گۆچـانی ئەسـتور ٥ قامـچی ئەستور.

الهُــرْيُ: هۆدەیــەکی گــەورە خــۆراکی پاشای تێدا کۆدەکرێتـەوە ٥ کەنـداو یان زەلکاو ئاوی لـێ هەڵـدەهێنجریٔ بەهۆی ئامێری ئاو هەڵێنجانەوە.

هَرْوَلَ: بڕوانە (هَرَلَ).

هَزَأَ بە ومنە هَزْءاً وهُزوءاً: گاڵتەی پیٔ کرد.

هَزَأَ الشَّيْئَ هَزْءاً: شتەکەی شکاند.

هَزَأَ إبلَهُ: حوشترەکانی خستنە بەرسـەرما تا فەوتان‌و لەناو چون.

هَزَأَ راحِلَتَهُ: وڵاخی سوارییەکەی ئاژوت.

هَزِئَ هَزَءاً: مرد.

هَـزِئَ بالـشَّيْئ ومنــە: گاڵتـەی بەشـتەکە کرد، گاڵتەی لەشتەکە هات.

أهْزَأ: کەوتە کوشندەی سەرماوە.

أهْــزَأت الدابــة بالرجــل: وڵاخەکــە بــەخێرایی پیاوەکــەی گەیانــدە شوێنی مەبەست.

أهزأ الرجلُ إبلَهُ: پیاوەکە حوشترەکەی لـیٔ خوڕی، ئاژوتی.

تَهَزّأ بالشَّيْ: گاڵتەی بەشتەکە هات.

اسْتَهْزَأ بغيرە: گاڵتـەی بەغـەیری خـۆی کرد.

الهازِئة: دەشتی چەواشە کەر، دەشتێك تراویلکـەی هـەبیٔ‌و ڕێبـوار بەهەڵـە بـەریٔ ٥ دەگـوتریٔ: (مفـازةٌ هاذِئـة): سارایەکە تراویلکەی هەیە ٥ (غـذاة

هازئة): ئێوارەیەکی سەرماو سۆڵە، مرۆڤ هەڵدەلەرزێنێ وەکوو یاری پێ بکا.

**الهُزَأَةُ:** پیاوێك ببێتە شوێنی گاڵتەی خەڵك.

**الهُزَأَةُ:** پیاوێك خۆی گاڵتە بەخەڵك بکات.

**هَزَبْرَةٌ:** بڕییەوە.

**الهِزَبْرُ:** شێری تێك شکێنەر ٥ جەستەی کەتەو پتەو ٥ (ك: هَزابر).

**هَزِجَ هَزَجاً:** گۆرانی گوت ٥ دەگوترێ: (هَزِجَ القارئ في قراءته): قورئان خوێنەکە دەنگی بەرز کردەوەو بەشەوقەوە قورئانی خوێند ٥ (فهو هَزِجٌ وهي هَزِجَةٌ).

**أهْزَجَ الشاعرُ:** شاعیرەکە بەگوێرەی بەحری هەزەج شیعری دانا.

**هَزَّجَ الرجلُ:** بەمانا (هَزِجَ)دێ.

**هَزَّجَ صَوتَهُ:** دەنگی خۆی هەڵبڕیو گۆرانی گوت.

**تَهَزَّجَ الرجلُ:** بەمانا (هَزِجَ)دێ.

**تَهَزَّجَ القوسُ:** کەمانەکە کاتێ مۆسیقاژەنەکە ژێیەکەی جوولاند، دەنگی هات ٥ دەگوترێ: (تَهَزَّجَ الرعدُ): هەورەکە گرماندی.

**الهَزَجُ:** هەر دەنگێك لارکردنەوەو درێژکردنەوەی تێدابێ ٥ گوڵە گۆڵی هەور ٥ ویزەی مێش و مێشولە ٥ کەیف و خۆشی و هەڵپەڕکێ ٥ جۆرە بەحرێکی عوروزە شیعری عەرەبی پێ کێشانە دەکرێ ٥ هەروا شیعری فارسی و کوردیشی پێ دەکێشرێ.

**هَزَرَ الرجلُ هَزْراً:** پیاوەکە پێکەنی.

**هَزَرَ البائع:** فرۆشیارەکە کاڵاکانی گران کردن.

**هَزَرَ فلان:** فلانکەس پەلەی کرد لە پێویستییەکەی دا.

**هَزَرَ لفلان:** بەخششی فلانکەسی زۆر کرد.

**هَزَرَ فلاناً بالعصا:** بەعەصاو گۆچان زۆری لەپشت و لاقەپرغەی فلان دا ٥ زۆری چاو لێ داگرت.

**هَزَرَ الأرضَ به:** زەوی پێ پەستاوت دای بەزەوی دا، خستی، دەری کرد، ترۆی کرد ٥ (فهو مهزور وهزير).

**المِهْزَرُ:** کەسێك لەهەموو شتێك دا تێ بشکێ و زەرەر بکا ٥ دەگوترێ: (رجل مِهزر).

**الهَزارُ:** بولبول ٥ وشەیەکی فارسییەو کراوە بەعەرەبی ٥ دانراوە بۆ بولبول ٥ بەفارسی پێی دەگوترێ: (هەزار داستان) چونکە بولبول بەزۆر ئاواز دەخوێنێ.

**الهِزْرُ:** هەڵخەڵەتێندراوی گێل

کەهەموو کەس تەماعی تێدەکا.

**الهَـــزْرَةُ**: زەوی نـــەرم ٥ تەمبـــەڵو تـەوەزەل ٥ دەگـوترێ: (رجـل فيـه هَـزَرات): پیاوێـکە زۆر تەمبەڵە ٥ (رجــــل ذو هَــــزَرات): پیاوێــــکە لەهەموو ئیشێکا تێ بشکێ.

**الهَزَوْرُ**: زەعیفو زەبوون.

**هَزْرَفَ فِي عَدْوِهِ**: لەبازدانەکەی دا گـورج بوو، زۆر رۆیی.

**الهُـزارِف والهِـزْرافُ**: گـورجو خێـرا ٥ جەستە گەورە.

**هَزْرَق**: پەلەی کرد.

**الهُزارِقُ**: بەمانا (الهُزارِفُ) دێ.

**هَزَّ الرجلُ هِزَّةً**: پیاوەکـە چوستو چالاك بوو، گەشەی کردو ئارامی گرت.

**هَـزَّ القِـدْرُ**: مەنجەڵەکـە لـەکاتی کوڵان دا قلْپە قلْپی هات، گیزەی هات.

**هَزَّ الشهابُ هزيزاً**: ئەستێرەکە کشا.

**هَـزَّت الـريحُ**: رەشـەباکە هـاژە هـاژی لەدرەختەکان هێنا.

**هَزَّ الرَّعْـدُ**: هەورەکـە گۆڵە گۆڵی هـات ٥ شریخو هوری هات.

**هَـزَّ الـشَيْئَ وبـه**: شـتەکەی راوەشـاند رای تەکاند ٥ قورئـان دەفـەرموێ: {وَهُـزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ}.

**هَــزَّ الهـواءُ والمـاءُ النبـاتَ**: هـەواو ئـاو گەشـەیان بەرووەکەکـە کـردو بـاڵای کرد.

**هَـــزَّ الحـادي الإبـلَ**: حودیـە خوێنەکـە بـەگۆرانی حوشـترەکەی خـستنە سـەر رەوتی خۆش رەوی.

**هَـزَّزَ الـشجرةَ ونحوهـا**: درەختەکـەی راتەکاند.

**إهْتَـزَّ الـشَيْئُ**: شـتەکە کەوتـە جـمو جوڵو هەڵتەكو داتەك.

**إهْتَزَّ النباتُ**: رووەکەکە گەشەی کـردو بەرزبۆوە.

**إهْتَــــزَّت الأرضُ**: زەوییــــە بــــەپیتو بەرەکەت بوو گیاو گژی رواند.

**اهْتَـــزَ الإبـــلُ**: حوشـــترەکە نیـــشاتی پەیداکرد لـە رۆسـشتنی داو کەوتـە سەر رەوتی خۆشرەوی.

**إهْتَــزَّ الرجـــلُ**: پیاوەکـــە نیـــشاتی پەیــداکردو کەوتــە سەرخۆشــیو تەندروستی ئارامی.

**إهْتَزَّ الشهابُ**: ئەستێرەکە بـەگورجیو تیژرەوی کشا.

**اِهْتَـزَّ لكـذا**: بەوشـتە کـەیف خـۆشو شادمان بوو.

**تَهَـزَّزَ الـشَيْئ**: شـتەکە کەوتـە جـمو جوڵ.

**الإهتـزاز**: حاڵـەتی جەسـتەیە لـەکاتی لەرینەوەدا.

**الهَزائِزُ**: چورتمو تەنگانە (تاکی نییـە)

٥ هەربەكۆ دێ.

**الهَـزَّةُ**: دەگـوترێ: (إمـرأة هَـزَّة): ئافرەتێكە شەڕانیو حەز لەئاژاوە دەكا ٥ (ك: هَزَّات).

**هَزَعَ هَزْعاً**: پەلەی كرد.

**هَزَعَتِ الدابَـةُ في الحشيش**: حەیوانەكە لەناو حەشیشەو لەوەڕدا لەوەڕا.

**هَـزَّعَ الـشَيْئَ**: شـتەكەی شـكاند ٥ دەگـوترێ: (هَـزَّعَ فلانـاً): ملـی فلانكەسی كوتا.

**هَـزَّعَ الأشْـياءَ**: شـتەكانی لێـك بلاوكردنەوە.

**إهْتَزَعَ**: پەلەی كرد ٥ چەواشە بوو.

**إهْتَـزَعَ الـسيفُ**: شمشێرەكە لەرەلەری كرد نەرمە لیقە بوو.

**إنهزعَ**: شكا ٥ وردبوو.

**تَهَزَّعَ**: بـەمانا (إهْتَـزَعَ)دێ ٥ دەگوترێ: (تهزّعت المرأةُ في مشيها): ئافرەتەكە لەرۆیشتن دا لارو لەنجەی كرد.

**تَهَزَّعَ فـلان**: فلانكـەس روی خـۆی گـرژ كرد روگرژیی بەسەر خۆی دا هێنا ٥ دەشگوترێ: (تهزع لفـلان): خـۆی لەفلان نەناس كرد.

**الأهْزَعُ مـن القـذائف والـسهام**: ئەومیە فیـشەكێك یـا تیرێــك بەتــەنیا لەفیشەكدانو تیردان دا مابێتـەوە ٥ دەشـگوترێ: (مـالي الـدار أهْـزَعُ):

كەس لەخانوەكەدا نییە.

**المِهْـزَعُ**: كەسێـك هـەر درەختێــك راوەشـێنێ بیـشكێنێ ٥ دەسـكی سندولو دەسكەوان.

**الهِزاعُ**: فیشەكو تیرە كە لەفیشەكدانو تیردان دابمێنێ.

**الهَزَعُ**: جمو جولو هەلبەزو دابەز.

**الهَزيـعُ مـن الليـل**: سێیەكی یەكـەمی شەو یان چواریەكی سەرەتای شـەو ٥ ئەحمەقو گێل ٥ (ك: هُزَعُ).

**الهَيْزَعَـةُ**: تـرسو هـەراو هۆریـای نـاو گۆڕەپانی شەڕ.

**هَزَفت الـريحُ الـشَيْئَ هَزْفـاً**: ڕەشـەباكە درەختەكـەی هەژانـدو موتوربـەی كرد.

**الهِزَفُ**: تەبیاتو وشكو سرك ٥ گورجو گۆل ٥ پەرڕێز.

**هَزِقَ هَزَقاً**: چوستو چالاك بوو.

**هَزِقَ في الضحك**: زۆر پێكەنی.

**أهْزَقَ في الضحكِ**: بـەمانا (هَزِقَ فيه)دێ ٥ واتە زۆر پێكەنی.

**المِهْـزاق مــن النــاس**: كەسێــك زۆر پێكەنینی هێواشی بێو كالفام بێ ٥ دەگـوترێ: (إمـرأة مِهـزاق): ئافرەتێكی كالفـامی هەمیشە دەم بەپێكەنینی لەسەرەخۆیە.

**الهَـزَقُ**: فێـزە فیـزو جـمو جـول ٥

قریشكەو تیژی دەنگی هەور.

الهَـزِقُ: بـەمانا (المِهـزاق)دێ ٥ دەنگـی هەور كە زۆر گەورەو توند بێ.

هَزَلَ هَزْلاً: لاواز بوو ٥ كزو كۆڵەوار بوو.

هَزَلَ القومُ: خەڵكەكە حەیوانەكانیان كزو لاواز بوون.

هَـزَلَ فـلان في كلامـه هـزلاً: فلانكـەس گاڵتـەو سـوحبەتی كـرد لەكارەكـەدا جیـدی نـەبوو، شـتەكەی بەهەوانتـە گرت.

هَزَلَ الرجُـلَ: پیاوەكە ئاژەڵەكانی منـدار بونەوەو هەژار كەوت.

هَـزَلَ الدابـةَ: وڵاخـەكـەی كزكـرد بـەهۆی ئەوەوە بەباشی بەخێوی نەكرد.

هَـــزِلَ فـــلان هَـــزْلاً: فلانكـــەس گاڵتـــەو سوعبەتی كرد.

هُزِلَ هُزالاً: زەعیفـو لاواز بوو، دەگوترێ: (هُزِلت حال فلان): وەزعو حـاڵی فـلان لاواز بوو، دایە نوشوستی.

أهْـــزَلَ الرجـــلُ: پیاوەكـــە ئـــاژەڵو وڵاخـــەكانی كـــزو لاواز بـــوون ٥ دەگوترێ: (أهْزَلَ القـومُ): خەڵكەكە گرانـــیو قـــاتو قـــڕی لـــەئاژەڵو وڵاخەكانیانی داو بەفرچون ٥ ماڵو دارایـی خۆیـان شـاردەوە لەترسـی قاتو قڕی.

أهْزَلَ الشیْئَ: شتەكەی لاواز كرد.

أهْـزَلَ فلانـاً: فلانكەسـی بەپیاوێـكی گاڵتـەبازو قەشمـەری كـەر هاتـە بەرچاو.

أهْزَلَ الدابَّةَ: وڵاخەكەی لاواز كرد.

هـازَلَ فـلان فلانـاً: فلانكـەس گاڵتـەی لەگەڵ فلان دا كرد.

المهزلة: كزو كۆڵەواریی ٥ قـاتو قـڕیو گرانـی ٥ وڕێنـە ٥ كارێـك زۆرینـەی گاڵتـەو سـوعبەت بـێ، شـتە جیدییەكانی كەم بن ٥ شانۆگەریو تەمـسیلییەك پێـكەنینو شـتی سەیرو عەنتیكەی زۆر تێدابێ.

المهزول من الشعر: ئەو شیعرەی بونیەو هەیكـەلی نارێـكو پێـك بـێ ٥ (ك: مهازیل).

الهُزَالُ: زەعیفـو لاوازیی.

الهُزَالَة: گاڵتـەو گـەپو شـتی پێـكەنین هاوردە.

الهِزِّیلُ: شتی زۆر گاڵتە ئامێز.

الهَزْلُ: وڕێنەو قسەی پڕو پوچ ٥ قسەی خاوو بێ تامو خوی.

الهَزْلی: مارو مۆر، پێڕی مار بە هەموو جۆرەكانیەوە.

الهزیل: زەعیفـو لاواز ٥ (ك: هَزْلی).

الهُزَیلی: هەڵسو كەوتی جادوبازو چاو بەسـتكەر كەبەفەنـدو فـێڵو چـاو بەستەكیو دەست سوكی برێ كاری

سەر سورهێنەر ئەنجام دەدا.

هَزْلَجَ: پەلەی کرد.

هَزْلَجَتْ الألفاظ: وشەو رستەکان تێکەڵو پێکەڵ بوون.

الهِزْ لاجُ: گورجو خێرا.

هَزِمَ الشَيْئُ هَزْماً وهزيماً: شتەکە ڕەنگی هات ٥ دەگوترێ: (هَزَمَ الرعدُ): هەورەکە گۆلاندی، شریخاندی.

هَزَمَتِ الريحُ: ڕەشەباکە هاشاندی، هاژاندی.

هَزَمَ فلان على فلان: فلانکەس بەزەیی بەفلانکەس دا هاتەوە.

هَزَمَ الشَيْئ: شتەکەی لۆلو خستە سەریەك، هەندێکی بەسەر هەندێکی دادایەوە.

هَزَمَ العَدُوَّ هزيمة: دوژمنی شکاندو بەسەری دا زاڵ بوو.

هَزَمَ الشَيْئَ: دەستی خستە ناو شتەکەوەو هەڵیکۆڵی ٥ چاڵی تێکرد.

هَزَمَ الأرضَ: گڵی لادا لەسەر یەکێ لەکاریزاوەکانو ئاوی زۆرو ڕونی لێ دەرهێنا.

هَزَمَ له حقه: مافی پێشێل کرد.

هَزَّمَ الشَيْئَ: شتەکەی شکاندو وردو هاڕی کرد.

هَزَّمَ العَدُوَ: دوژمنی شکاندو بەسەری دا زاڵ بوو.

إهْتَزَمَ الفَرَسُ: ئەسپەکە خرمە خرمی ڕۆیشتنی هات.

إهْتَزَمَتِ السَحَابَةُ: هەورەکە لەگەڵ گۆڵەو گرمە گرم دا بارانیشی باراند.

إهْتَزَمَ الأمْرَ: بڕیاری کارەکەی داو پەلەی کرد بۆ ئەنجامدانی.

إهْتَزَمَ الشاةَ: مەڕەکەی سەربڕی ٥ لەپەندی پێشینان دا هاتووە (اهتَزِموا ذبيحتكم مادام بها طِرق): کوشتییەکە سەرببڕن پێش ئەوەی کزو کۆڵەوار بێ.

تَهَزَّمَ الشَيْئُ: بەمانا (إهْتَزَمَ) دێ ٥ دەگوترێ: (تَهَزَّمَ الفرسُ): ئەسپەکە خرمە خرمی ڕۆیشتنی هات ٥ (تَهَزَّمت السحابة بالماء): هەورەکە گۆلاندیو بارانیشی باراند.

تَهَزَّمَت العصا: عەصاکە شکاو قرچەی هات.

تَهَزَّمَ الرعدُ: هەورەکە گۆلاندی.

تَهَزَّمَ البناءُ: باڵەخانەکە تێك ڕوخا.

استهزَمَ العَدُوَّ: دوژمنی شکاندو بەسەری دا زاڵ بوو.

المِهْزامُ: گۆچانو عەصای کورت ٥ کۆڵەوەژو داری ئاگر خۆشکردن ٥ دارێکە سەرەکەی ئاگری تێ بەردەدرێو منداڵ یاری شەڕە

ئاگری پیَ دەکەن ٥ هەروا ئاوە بۆ یارییەك منداڵ دەیکەن دەهێنن سەری یەکێکیان بەپارچە پەڕۆیەك دادەپۆشن، ئەمجار یەکە یەکە ئەوانی تر بەدەست لێی دەدەن هەمووجارێ دەڵێن کێ بوو پێی کێشای؟ کەهەڵی هێنا کێ پێی کێشاوە ئیتر پەڕۆکە دەخەنە سەر سەروچاوی ئەوی ترو لێی دەدەن هەتا دەزانێ کێ لێی داوەو ئاوەکەی دەڵێ هەروا تا کۆتایی ٥ (ك: مهازیم).

**الهَازِمَةُ:** بەڵاو کارەسات ٥ (ك: هوازم).

**الهَزْمُ:** زەوی نەرمو شێوە چاڵو تەخت ٥ گەدەو ریخۆڵە ٥ هەوری تەنك کەئاوی تێدانەبێ ٥ کونو درزی کوندەی ئاو.

**الهَزَمُ:** دەنگ ٥ دەنگی کەوانی تیر ٥ فرە فری تیر.

**الهَزِمُ:** ئەسپی جڵەو خۆش ٥ بارانی بەردەوامو درێژخایەن ٥ دەشگوترێ: (فرس هزِم الصوت): ئەسپێکە دەنگی وەکوو دەنگی هەور وایە، حیلەی دەڵێی هەورە دەگۆڵێنێ.

**الهَزْمَةُ:** زەوی نەرمو مەیلەو چاڵ ٥ دەنگو گرمە.

**هزمة السَّنور:** دەنگی قورگی پشیلە ٥ قوڵکەو چاڵی هەڵکەنراو لەبەرد ٥ (ك: هزم وهزوم).

**الهَزْمَةُ:** بزنی دووساڵ.

**الهَزِمَةُ من القدور:** مەنجەڵێك دەنگی قڵپە قڵپو کوڵانی ببیسرێ.

**الهِزْمَةُ من الدواب:** وڵاخی کزو کۆڵەوارو لاواز.

**الهَزُومُ:** شتێك بەئاشکرا دەنگی جەرەسی لێ بێ.

**الهَزِيمُ:** گۆڵە گۆڵی هەور ٥ دەنگی خرمە خرمی ڕۆیشتنی ئەسپ ٥ ئەسپی حیلکە گەورە ٥ بارانی درێژخایەنو بەردەوام ٥ دوژمنی شکاوو ڕەتێندراو.

**الهَزِيمَةُ:** تێك شکاو لەشەڕدا ٥ بیرێك ئاوی زۆر بێ ٥ وڵاخو ئاژەڵی کزو لاواز ٥ ئەسپی عەرەق کردو بەهۆی زۆر ڕۆیشتنو ماندو بوونەوە ٥ (ك: هزائم).

**الهِزِّمي:** تێکشکانی تەواوو جەرگبڕ.

**الهَيْزَمُ:** شێر ٥ پتەوی ڕەقو ڕەختە.

**الهَزْمَجَةُ:** قسەکردنی خێرا خێراو لێکدان لێکدان ٥ گاڵو بوغڵو تێکەڵاو بوونی دەنگەکان.

**هَزْهَزَ الشَيْئَ:** شتەکەی لەرە لەر پێ کرد، خستیە شەقەتۆڵە ٥ زەلیلو ملکەچی کرد.

تَهَزْهَزَ اليه القلب: دڵی بۆی لێ دا ٥ دڵی پێی کرایەوە.

الهُزاهِزُ من الماء: ئاوی زۆری ڕەوان کەلەبەر زۆری کڵەو بکا ٥ ئەگەر بۆ شمشێر بەکارهات مەبەست شمشێری بریسکەدارو سپیو بێ پەڵەو لەکەیەکە لەکانو مەعدەنی ڕەسەن دروست کرابێ.

الهُزْهاز: دەق بەمانا (هُزاهِز)ەێ.

الهُزْهاز من الآبار: بیری قوڵ، زۆر قوڵ.

الهَزْهَزَة: بەڵاو کارەسات کەخەڵك بتاسێنێو مەدهۆشیان بکا.

هَزَا هَزْواً: ڕۆیی.

هَسْ: وشەیەکە بۆ دەرکردنی مەڕو بزن ٥ فەرمانکردنە بە بێدەنگ بوون واتە وسبە.

هَسَّ فلان هَساً: فلانکەس لەبەر خۆیەوە قسەی بۆ خۆی کرد.

هَسَّ الشَيْئَ: شتەکەی باریك کردەوەو شکاندی.

هَسَّ الكلامَ هَسيساً: قسەکانی لەسەر خۆ کردن.

هَسَّ الطفلَ: لەمنداڵەکە تورەبوو بۆئەوەی بێدەنگ بێ.

الهسيسُ: وردکراوو هاڕاو لەهەرشتێك بێ.

الهَمَسُ: قسەی سرتە کەلێی حاڵی نەبی.

هَسْهَسَ الرجلُ: پیاوەکە شەو ڕۆیی.

هَسْهَسَ ليلته كلها: شەوەکە هەمووی بەڕێوە بوو هەر ڕۆیی ٥ نوزەی لێوە هات ٥ دەشگوترێ: (هَسْهَسَ الخلخالُ وهَسْهَسَت الدرعُ).

هَسْهَسَ الماءُ: ئاوەکە بەڕونیو جوانی هاتە خوار.

هَسْهَسَ الحديث: قسەکەی شاردەوە.

تَهَسْهَسَ: بەمانا (هَسْهَس)ەێ.

الهَسَاهِسُ: ڕۆیشتن بەشەو ٥ دەنگی سمی حوشتر ٥ قسەی بەنەسپایی.

الهُسَاهِسُ: قسەی ناو دڵ وتو وێژی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆی ٥ وەسوەسەو دەنەدەنەی ناو دەروون.

الهَسْهَاسُ: قسەی بەنەسپایی کەلێی حاڵی نەبێ ٥ ئەوکەسەی شەو ناخەوێو خەریکی ئیشکردنە ٥ قەساب ٥ ڕۆیشتنی خێرا.

الأهْسَاءُ: خەڵکانێك کەدەکەونە حاڵەتی سەر سوڕمانو تاسانەوە.

هَشَرَ الناقةَ هَشْراً: هەرچی لەگوانی حوشترەکەدا هەبوو هەمووی دۆشی.

هُشَرَ البعيرُ: حوشترەکە سییەکانی سوتان.

الهَشْرُ: سوکیو تەنکی شت.

الهَشْرَةُ: کەیفو خۆشیو تەڕدەماخی.

**الهَشِرَةُ:** درەختێك زوو گەڵای هەڵوەرێ.

**الهَشُورُ:** بەمانا (الهَشِرَةُ)دێ.

**الهَيْشَرُ:** پیاوی درێژی شلو شێواو ٥ هەروا ناوە بۆ روەكێك بەتەمەنو چقڵاوییە لەپێری روەكی مورەكەبەیە لەوڵاتی میصرو ولاتانی سەر دەریای ناوەڕاست دەڕوێ بالای بەئەندازەی ٣٠سم تامەترێك بەرز دەبێتەوە ٥ قەدو لاسكەكەی نەرمو شێوەڵ شێوەڵە ٥ گەڵاكانی بەسەر خۆی دا شۆڕ دەبنەوە، لای خواروی چقڵاویو كەلكەلە روبەری سەروی لوسو گوڵەكانی زۆرو رەنگ شینن میوەكەی وەكوو دەنكە قەزوان وایە.

**هَشَّ الرجل هَشّاً:** بەگۆچانو عەصا هەڵمەتی بۆبرد.

**هَشَّ الشجرةَ:** بەگۆچان درەختەكەی تەكاند، درەختەكەی كوتا بۆ ئەوەی گەڵاكانی هەڵوەرێ ٥ قورئان دەفەرموێ: {وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي}.

**هَشَّ اليه وله:** دڵی پێی كرایەوە ٥ پێی دڵخۆش بوو.

**هَشَّ الخبز ونحوه هشاً وهشوشةً:** نانەكە تەنكو وشكو رەق بوو خێرا ورد بوو.

**هَشَّ العودُ:** عودەكە شكا ٥ نەمامەكە شكا.

**هَشَّ الشَيْئُ هشوشةً:** شتەكە كلۆرو بێ هێز بوو.

**هَشَّشَ فلاناً:** فلانكەسی كەیف خۆش كرد تەڕدەماخی كرد ٥ هەوڵی لاوازكردنیو زەعیف بوونی دا.

**إهْتَشَّ فلان للأمر وبه:** فلانكەس حەزی لەكارەكە بوو، دڵی بۆی لێ دا.

**استهش الشَيْئَ:** شتەكەی بەسوكو بێ نرخ زانی، سوكی كرد.

**الهَشُّ:** شتێك بەئاسانی بشكێ ٥ دەگوترێ: (خبز هَشّ): نانێكی رەقو تەنكە هەر لە خۆیەوە ورد دەبێ ٥ هەرشتێك نەرمو تەنكو خۆنەگربێ ٥ پیاوی روخۆشو دەم بەپێكەنین ٥ ئەسپێك زۆر ئارەق بكا ٥ دەشگوترێ: (فرس هش العنان): ئەسپێكە جڵەو نەرمە، جڵەو خۆشە.

**الهَشّاشُ:** دەگوترێ: (خبز هَشاش): نانێكە رەقو تەنكە هەر لەخۆیەوە ورد دەبێ.

**الهَشاشَةُ:** (هشاشة العظام): نەخۆشییەكە زكماكە توشی كۆئەندامی ئێسكی مرۆڤ دەبێ.

**الهَشّاشَةُ:** كوندە ئاو كەلەبەر تەنكیو

